# پێشەکی

## ﴿بسم الله الرحمان الرحيم﴾

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان ، بەناوی ئەو خودایەی کە هیچ هەواڵ و هاوشێوە و هاوتایەکی نیە و تاک وتەنیایە ، بەناوی ئەو خودایەی کە هەر تەنیا خۆی دروستکەری زەوی و ئاسمانەکانە کە هیچ هاواڵ و هاوتایەکی نەبوە و نابێ نە لە دروستکردن و نە لە بەڕێوەبردنی و نە لە یاسا دانانی ئەم گەردونە،**

ئێمە الحمدلله کە موسڵمانین و لەناو گەلێکی موسڵمان گەورەبوین و پەروەردەبوین ، الحمدلله هەموومان نوێژەکەین و بەشێوەیەک خودا ئەپەرستین و بەندایەتی بۆ ئەکەین ، بەڵام بەداخەوە زۆرێکمان نوێژەکەین بەڵام نە لێی تێدەگەین نە چێژی لێدەبینین ، وە لە چۆنیەتی نوێژکردن و ئادابەکانی تێنەگەیشتووین ، ئەویش بەداخەوە بەهۆی نەبوونی کەسێک کە فێرمانبکات بەتەواوی یان هەر بابەتێک لەم جۆرانە ، هەر لەبەر ئەوەشە کە هیچ چێژ و خۆشیەک لە نوێژەکەمان نابینین و لەزەتی لێناکەین و هەر پەلەمانە کە زوو نوێژەکە تەواوکەین و بڕۆین ، کە زۆر لەم بابەتە هەڵە تێگەیشتووین ، پێش هەموو شتێک نوێژ بریتیە لە قسەکردن لەگەڵ خودا بەڕاستەوخۆیی ، بۆیەش بە پێویستم زانی کە دەربارەی ئەم بابەتە هەندێک شت ڕونکەمەوە،

منیش إن شاء الله لێرەدا دەستمکردوە بە نوسینی چەند بابەتێک دەربارەی (دەستنوێژ و نوێژ و زیکرەکان)بەڵکو ببێتە هۆی سوود بەخشین بە دواڕۆژمان و ڕەزامەندی خودای گەورەی پێبەدەست بێنین، خودای گەورە بە نیەتێکی پاکەوە لێمانی وەرگرێ.

**تێبینی: ئەم کتێبە تەنها بۆ ئەو کەسانە نوسراوە کە خوێندەواری عەرەبی نازانن و شێوازی دەربڕینی پیتەکان نازانن ، بۆیە زیکر و ئایاتەکانم بەکوردی نوسیوە تەنیا بۆ ئەوەی شێوازی خوێندنەوەی زیکر و ئایەتەکان فێربن ، وهەر کەمو کوڕیەک یان هەڵەیەکیشمان هەیە خودا بەگەورەیی خۆی بمانبورێ و مەبەستمان هیچ نەبووە تەنیا ڕازیکردنی خودانەبێ و ئێمە بێبەرینین لەهەڵە و ئەوەی کامڵە تەنیا خودایە و ئەوەیە کە خودا ویستی لەسەرە و خودای گەورە بە گەورەی خۆی بە إخلاصەوە لێمان وەرگرێ.**

أبو عائشة الكردية

٢٠٢٤/١/٢٧ ز

١٦/رجب/١٤٤٥ هـ

«بسم الله الرحمان الرحيم»

## لێرەدا با هەندێک باسی نوێژ بکەین:

نوێژ بریتیە لە چێژ و لەزەت و خۆشی ، بریتیە لە ئارامی دڵ و دەروون ، بریتیە لە عیبادەت و یادکردنەوەی خودا و ڕازیکردنی خودا لەخۆت ، نوێژ بریتیە لە قسەکردن لەگەڵ خودا ،

تۆبینە پێش چاوت کە کەسێکی ناودار لەبەر دەمتدایە و گوێیگرتووە بۆت ، باشە چ هەستێکت هەیە؟

ئەی چی دەڵێی و چ هەستێکت هەیە کە ئەو خودایە ڕۆژانە بەلایەنی کەمەوە پێنج جار لەبەردەمت ڕاوەستاوە و گوێت بۆ ئەگرێ؟

ئەو خودایەی کە دروستکەری هەموو ئەو کەسانەیە کە بەئاواتی جارێک بیانبینی ، ئەو خودایەی دروستکەری هەموو ئەو شتانەیە کە بە ئاواتی پێیان بگەی ، ئەو خودایەی دروستکەری هەموو ئەو شوێنانەیە کە بە ئاواتی بیانبینی تەنیا جارێکیشبێ ، ئەو خودایە کە دروستکەری هەموو ئەوشتانەیە کە پێیان سەرسامی ، ئەو خودایەی دروستکەری هەموو شتێکە کە بوونی هەبێ ، هەرچی بوونی هەیە و دەیانبینی دروستکراوی ئەون و ئەو خاوەنیانە ،

باشە ئەو پسیارە لەخۆت بکە ،

ئایە هیچ ترس و هەستێک دەتگرێ کاتێک لەبەردەمی ئەو خوایە ڕاوەستاوی؟

باشە هیچ تام و چێژێک لەو نوێژە دەکەی کە دەیکەی ، کە بریتیە لە قسەکردن لەگەڵ ئەو خودایەی کە دروستکەری هەموو ئەو دروستکراوانەیە؟

جا ئێمە لێرەدا إن شاء الله دەست پێدەکەین بە ڕونکردنەوەی هەندێک بابەت ، بەڵکو بەلایەنی کەمەوە هەندێک لەو چێژی نوێژە بەدەستبێنن بەویستی خودا،

بۆیەش پێش هەموو شتێک دەبێ بزانین ئەو وشە و زکرانەی کە دەیانڵێین مانایان چیە و چۆن دەخوێندرێنەوە تاکو بزانین کە ئێمە چی لەگەڵ خودا دەڵێین و داوای چی لێدەکەین.

﴿با لەم دونیایە کورتە بە زکر و یادی خواوە بەڕێی بکەین بۆ ڕەزامەندی خودا و بەدەست هێنانی بەهەشتێکی یەکجاری کە نە خەم هەیە نە خەفەت لەو بەهەشتەدا و بۆ هەتا هەتایە لەناوی دەمێنینەوە بەبێ مردن ﴾

**یارب پێمانی ببەخشی (ئامین)**

## چەند زکرێک و مانایەکەیان ؛

پێشەکی دەستپێدەکەین بە چەند زیکرێک و مانایەکەیان کە ڕۆژانە ئێمە دوبارەی دەکەینەوە بەبێ ئەوەی مانایەکەیان بزانین.

زیکری یەکەم/

[عربی]سبحان الله

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]سوب حانەڵڵا

ماناکەی/ پاک و بێگەردی تەنیا بۆ الله یە

... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری دووەم/

[عربی]الحمدلله

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]ئەلحەمدولیللا

ماناکەی/ سوپاس و ستایش تەنیا شایستەی الله یە

زیکری سێیەم/

[عربی]لا إله إلا الله

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] لائیلاهە ئیلەڵڵا

ماناکەی/هیچ خودایەک نیە بەهەق جگە لە الله

... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری چوارەم/

[عربی]الله اکبر

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]ئەڵڵاهو ئەکبەر

ماناکەی/خودا گەورەترینی گەورەکانە

... ... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری پێنجەم/

[عربی]استغفرالله

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]ئەستەغفیروڵڵا

ماناکەی/خودایە لێمخۆشبە

## زیکری شەشەم/

[عربی]سبحان الله وبحمده

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]سوب حانەڵڵا وەبیحەمدی

ماناکەی/پاکوبێگەردی بۆتۆیە خوایە و سوپاس و ستایشیش هەر بۆتۆیە

••• ••• ••• ••• ••• ••• ••• •••

## زیکری حەوتەم/

[عربی]سبحان الله العظیم

[چۆنیەتی خوێندنەوەی]سوبحانەڵڵاهیل عەزیم

ماناکەی/پاک و پێگەردی هەربۆتۆیە خودای گەورە

••• ••• ••• ••• ••• ••• ••• •••

زیکری ناونوێژ (لە ڕکوع):

## زیکری هەشتەم/

[عربی] سبحان رب العظیم

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] سوبحانە ڕەبیئەل عەزیم

ماناکەی/پاکو بێگەردی بۆتۆ خودای گەورە

## زیکری ناو نوێژ (لەسوجدە):

زیکری نۆیەم/

[عربی]سبحان رب الاعلی

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] سوبحانە ڕەبیئەل ئەعلا

ماناکەی/پاکو بێگەردی بۆتۆیە ئەی ئەو خودایەی بەرز و بڵندترینی

... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری دەیەم/

[عربی]استغفرالله واتوب إِلیه

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] ئەستەغفیروڵڵە وەئەتوبو ئیلەیهـ

ماناکەی/خودایە لێمخۆشبە وە لەداهاتوشدا گەڕانەوەم هەر بۆلای تۆیە

... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری یانزەیەم/

[عربی]اللهم صلی علی محمد وعلی ال محمد

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] ئەڵڵاهوم مەسەڵلی عەلا موحەممەد

وەعەلا ئالی موحەممەد

واتاکەی/خودایە درود و سەلامی پێکۆتا بڕژێنە بەسەر موحەممەد ﷺ و

شوێنکەوتوانی موحەممەد ﷺ

زیکری دوانزەیەم/

[عربی]اللهم إنی أسألك الجنه

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] ئەڵڵاهوم مە ئیننی ئەسئەلوکەل جەننە

واتاکەی/خودایە بمخەرە بەهەشتەوە

... ... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری سێنزەیەم/

[عربی] اللهم إنی أعوذ بك من العذاب جهنم

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] ئەڵڵاهوم مەئیننی ئەعوذوبیکە مینەل عەذابی جەهەننەم

واتاکەی/خودایە بمپارێزە لەئاگری دۆزەخ

... ... ... ... ... ... ... ... ...

زیکری چواردەیەم /

[عربی]لا حول ولا قوة الا بالله

[چۆنیەتی خوێندنەوەی] لا حەولە وەلا قووەتە ئیللا بیللا

واتاکەی/هیچ کەسێک ناتوانێ هیچ شتێکم بەسەربێنێ تەنیا بەویستی خودا نەبێ

## ئایەتی کورسی؛

ئایەت/ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ

شێوازی خوێندنەوەی/ ئەڵڵاهو لا ئیلاهە ئیللا هوەل عەییول قەییوم

ماناکەی/

خوای گەورە ئەو زاتەیە کە هیچ پەرستراوێک نیە بەهەق جگەلە ئەو و ئەوخوایەیە کە هەمیشە زیندوە و نامرێ و هەر ئەویش بەڕێوەبەری هەموو مرۆڤ و دروستکراوەکانیەتی.

ئایەت/ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ

شێوازی خوێندنەوەی/ لا تەئخوذوهو سینەتوَ وەلا نەوم

ماناکەی/

نە خەوە چوڕکە دەیباتەوە و نە خەوی لێدەکەوێ

ئایەت/ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ

شێوازی خوێندنەوەی/ لەهو مافیس سەماواتی وەمافیل ئەڕد

ماناکەی/

هەرچی لە ئاسمان و زەویە و ئەوەی لەنێوانیاندایە هەمووی موڵکی ئەوە

ئایەت/ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ

شێوازی خوێندنەوەی/ مەنذەل لەذی یەشفەعو عیندەهو ئیللا بیئیذنی

ماناکەی/

هیچکەسێک ناتوانێ شەفاعەت بکات لای خوای گەورە ئیللا بەئیزنی خودا نەبێ(کە ڕێگە بدات بە شەفاعەت بۆ تکاکار و تکاکەرەکە نەبێ)

ئایەت/ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ

شێوازی خوێندنەوەی/ یەعلەمو مابەینە ئەیدیهیم وەما خەلفەهوم

ماناکەی/

خوای گەورە زانایە بە ڕابردو ئێستا و داهاتوتان (واتا هەموو شتێک دەزانێ کە بەسەرمان هاتوە و بەسەرماندێ و هەر شتێکیشمان بەسەربێ هەر بەویستی ئەوە و تاقیتان دەکاتەوە)

ئایەت/ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ

شێوازی خوێندنەوەی/ وەلا یوحیتونە بیشەیئمّ مین عیلمیهی ئیللا بیماشائـ

ماناکەی/

بەڵام مرۆڤەکان هیچ زانیاریەکیان بەخوای گەورە و سیفاتەکانی نیە و نازانن تەنیا ئەوە نەبێ کە خوای گەورە خۆی مەبەستی لێبوە و لەسەر زاری پەیامبەرەکانی شتێکیان بۆڕونکاتەوە

ئایەت/وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ

شێوازی خوێندنەوەی/ وەسیعە کورسییوهوس سەماواتی وەل ئەڕد

ماناکەی/

کورسی خوای گەورە تەواوی ئاسمانەکان و زەوی داگیرکردوە

ئایەت/ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ

شێوازی خوێندنەوەی/ وەلا یەئودوهو حیفزوهوما

ماناکەی/

وەڕاگرتن و پاراستنی ئاسمانەکان هیچ گراننیە و ماندوی ناکات

ئایەت/ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ

شێوازی خوێندنەوەی/ وەهوە عەلییول عەزیم

ماناکەی/وەهەر ئەو زاتە بەرز و بڵند و گەورەیە

# سورەتی الفاتحە:

ئەو سوڕەتە باس لە پەرستنی خودا دەکا و خۆ یەکلایکردنەوە بۆ خوا پەرستی و بە گەورە دانانی خودا و خۆ زەلیلکردن لە ئاست ئەو زاتە گەورەیە کە اللەیە و خۆبێبەریکردن لە هەموو شتێک جگە لەو ، ئەو سوڕەتە ژمارەی ئایەتەکانی ٧ ئایەتە و لە مەککە دابەزیوە و ، ئەو سوڕەتە بە (ام القرآن یان ام الکتاب)واتا دایکی قورئان یان دایکی کیتاب ناوبراوە ،

ئەم سوڕەتە یەکێکە لە ئەرکانەکانی نوێژ ، ئاگەداربن نوێژکردن بەبێ خوێندنی ئەم سوڕەتە قبوڵ نیە و بۆیە نابێ ئەم سوڕەتەت دوای وەکو ئەوە وایە کە نەتخوێندبێ ، بۆیە نوێژەکەت هەڵدەوەشێتەوە.

## وشە/(اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)

[شێوازی خوێندنەوەی] ئەعوذو بیللاهیم مینەش شەیتانیڕ ڕەجیم

ماناکەی/

خودایە پەناتپێدەگرم لەشەیتانی نەعلەت لێکراو

## ئایەت /بسم الله الرحمان الرحیم﴿ ١ ﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ بیسمیللاهیر راحمانیر رەحیم

ماناکەی/

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

ئايەت /ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿ ٢ ﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ ئەلحەمدولیللاهیرِ ڕەببیل عالەمین

ماناکەی/

سوپاس وستایش هەر شایسەتی ئەو خودایەیە کە پەروەردگاری هەموو جیهان و بونەوەرانە (کە الله یە)

ئايەت / ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ ٣ ﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ ئەڕ ڕەحمانیڕ ڕەحیم

ماناکەی/

بەخشندەی میهرەبان

ئايەت / مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿ ٤ ﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ مالیکیەو میددین

ماناکەی/

خاوەن و پاشای ڕۆژی پاداشت و سزایە (مەبەستی لە ڕۆژی قیامەتە)

ئایەت / إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴿٥﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ ئییاکە نەعبودو وەئییاکە نەستەعین

ماناکەی/

خودایە تەنیا تۆ دەپەرستین و تەنیا گوێڕایەڵی تۆدەبین (تەنها شوێن بەرنامە و پڕۆگرامەکەی تۆدەکەوین)

ئایەت / ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾

شێوازی خوێندنەوەی/ ئیهـ دینەس سیڕاتەل موستەقیم

ماناکەی/

خودایە ڕێنوێنیمانبکە بۆ ڕێگا و ڕێبازە ڕاستەکەی خۆت (کە ئیسلامە و شارەزامان بکە و ، هەر لەسەر ئەو ڕێبازەش بمانژیەنە و بمانمرێنە)

ئایەت /صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ

شێوازی خوێندنەوەی/ سیڕاتەل لەذینە ئەنعەمتە عەلەیهیم،

ماناکەی/

بمانکە سەر ڕێگا و ڕێبازی ئەوکەسانەی کە ناز و نیعمەتی خۆتت بەسەردا ڕشتون (وەک پێغەمبەران و پیاوچاکان و ڕاستگۆیان و شەهیدان)

## ئایەت / غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ

شێوازی خوێندنەوەی/ غەیریل مەغدوبی عەیهیم،

ماناکەی/

وە لەو کەسانەمان بەدوربگری کە خەشم و قینی خۆتت بەسەردارِشتون (وەکو جولەکەکان)

## ئایەت /وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

## شێوازی خوێندنەوەی/ وەلاد داللین

ماناکەی/

وە بەدورمانبگری لە ڕێگا و ڕێبازی گومڕا و سەرلێشێواوانیش (وەکو مەسیحی و گاورەکان)

## وشە / أَمِين

شێوازی خوێندنەوەی/ ئامین

ماناکەی /

ئەی پەروەردگارم وەڵامی دوعاکانمان بدەوە و وەریگرە

## سوڕەتی الإخلاص:

وشەی(ئیخلاس) بەمانای دڵسۆزی دێت،
ئەم سوڕەتە باس لە یەکخوا پەرستی و تاک و تەنیایی خودا و بەتاکدانانی خودا دەکا ، ژمارەی ئایەتەکانی ٤ ئایەتە و لەمەککە دابەزیوە.

وشە/ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ بیسمیللاهیر ڕاحمانیر ڕەحیم

ماناکەی/

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

ئایەت/ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴿ ١ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ قول هوەڵڵاهو ئەحەد

ماناکەی/

خودایگەورە فەرمانمان پێدەکا و دەفەرموێ(بڵێ خودای من کە ناوی ئەڵڵایە تاک و تەنیایە)

ئایەت/ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿ ٢ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ ئەڵڵاهوس سەمەد

ماناکەی/

خودا زاتێکی دەسەڵاتدارە و پێویستی بە کەسنیە(تەنیا ئێمە پێویستمان بە ئەوە)

ئایەت/ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿ ٣ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ لەم یەلید وەلەم یولەد

ماناکەی/

نە منداڵی لێدەبێ و نە لە کەسیش بوە ( ئەوە ڕەددانەوەی هەموو ئەو بێبڕوایانەیی کە دەڵێن خودا کوڕی هەیە وەک جولەکە و مەسیعی )

ئایەت/ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿ ٤ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ وەلەم یەکوللەهو کوفوەن ئەحەد

ماناکەی/

وەهیچ هاوتا و دەسەڵاتدارێک نیە کە هاوشێوەییێ

# سوڕەتی الفلق:

(فەلەق واتە بەرەبەیان)

ئەو سوڕەتە مەککەییە و ژمارەی ئایەتەکانی ٥ ئایەتە ، ئەم سوڕەتە بریتیە لە پەناگرتن بە خوای گەورە لە چەند شتێک وەک (فیتنە ، سەحر و جادو ، چاوپیسی و حەسودی) بۆیە سوننەتە لە بەیانیان و ئێواران و پێش خەوتنان بیخوێنین

وشە/ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ بیسمیللاهیر راحمانیر رەحیم

ماناکەی/

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

ئایەت / ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ ١ ﴿

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ قول ئەعوذو بیرەببیل فەلەق

ماناکەی/

خودای گەورە پێمان دەفەرموێ (بڵێ پەنادەگرم بەو پەروەردگارەی بەرەبەیان دێنێ)

ئایەت /مِن شَرِّ مَا خَلَقَ﴿ ٢ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ مین شەڕری ماخەلەق

ماناکەی/

لەشەڕ و خراپەی هەموو ئەو دروستکراوانەی کە دروستتکردون

ئایەت / وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴿ ٣ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ وەمین شەڕری غاسیقین ئیذا وەقەب

ماناکەی/

وە خوایە پەناتپێدەگرم لە شەڕو خراپەی شەو کاتێک تاریکی دێت

ئایەت / وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ﴿ ٤ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ وەمین شەڕرین نەففاساتی فیل عوقەد

ماناکەی/

وە خوایە پەنات پێدەگرم لە شەڕ و خراپەی ساحیر و

فاڵگرەوەکان

ئایەت / ﴿وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾ ٥

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ وەمین شەڕری حاسیدین ئیذا حەسەد

ماناکەی/

وە خودایە پەنات پێدەگرم لە شەڕ و خراپەی حەسود و چاوپیسەکان

* * * * * * * * * * * * * * *

# سوڕەتی الناس:

(ناس واتا خەڵکی)

ئەم سوڕەتە لە مەککە دابەزیوە و ژمارەی ئایەتەکانی ٦ ئایەتە،

ئەم سوڕەتە بریتیە لە پەنا گرتن بەخودا لە شەیتانەکانی جن و ئینس.

وشە /﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ بیسمیللاهیر راحمانیر رەحیم

ماناکەی/

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

ئایەت / ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ١

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ قول ئەوعوذو بیرەببین ناس

ماناکەی/

بڵێ پەنا دەگرم بە خودای هەموو خەڵکی(مەبەستت لە الله یە)

## ئایەت / مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿ ٢ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ مەلیکین ناس

ماناکەی/

پادشا و خاوەنی هەموو خەڵک(کە الله یە)

## ئایەت / إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿ ٣ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ ئیلاهین ناس

ماناکەی/

پەنا دەگرم بە پەرستراوی ڕاستەقینەی خەڵک (کە الله یە)

ئایەت / مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴿ ٤ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ من شەڕریل وەس واسیل خەنناس

ماناکەی/

پەنات پێدەگرم لە شەڕ و وەسوەسەی شەیتانی نەعلەت لێکراو

ئایەت / ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿ ٥ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ ئەللەذی یووەسویسو فی سودورین ناس

ماناکەی/

پەنات پێدەگرم لەوەی بەردەوام وەسوەسە دروست دەکا لە دڵی خەڵکی(مەبەستی شەیتانە)

ئایەت / مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿ ٦ ﴾

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ منەل جیننەتی وەنناس

ماناکەی/

پەنات پێدەگرم لە هەرچی شەیتانی جن و ئینسانە ، (دیارە کە دوو جۆ شەیتانمان هەیە شەیتانی جن و شەیتانی مرۆڤ ، شەیتانی مرۆڤ ئەو شەیتانانەن کە بەردەوام ئەمرت پێدەکەن بە خراپە و گوناهو تاوان بەردەوام هەوڵیان گومڕاکردنی بەندەکانی خودایە)

# مەرجەکانی قبوڵبونی دەسنوێژ:

**مەرجەکانی قبوڵبونی دەسنوێژ ٦مەرجن...**

یەکەم/نیەت هێنان لە دڵەوە

دووەم/شوشتنی دەموچاو

سێیەم/شوشتنی دەست هەتا قۆڵ

چوارەم/مەسحکردنی سەر

پێنجەم/شوشتنی قاچ تا گۆزینگ

شەشەم/ڕێزبەندیکردنی ئەوانەی کە باسمانکرد (واتە دەبێ یەکەمجار یەکەم خاڵیان بکەی دوای دووەم دوایی سێیەم ، تا دوایی...)

⛔تێبینی:ئەگەر هاتوو لەم ئەندامانە ئەندامێکت پێش قلێکیان شوشت یان خاڵێکیانت پێش خاڵێکیان ئەنجامدا بۆنمونە یەکەمجار خاڵی سێیەمت ئەنجامدا پێش دووەم ئەوە دەبێ بڕۆیەوە خاڵی دووەم ئەنجامدەی ئینجا سێیەم دووبارەبکەیەوە ،
و ئاگەداربن گەر خاڵێک لەو خاڵانە جێبەجێ نەکەی ئەوە دەسنوێژەکەت قبوڵنیە و نوێژی بێدەسنوێژیش قبوڵنابێ.

# سوننەتەکانی دەسنوێژ:

## سوننەتەکانی دەس نوێژ دەسوننەتە...

یەکەم/گوتنی (بسم الله)

دووەم/شۆردنی هەردوو لەپیدەست

سێیەم/ئاو لەدەم وەردان

چوارەم/ئاو لەلوت وەردان

پێنجەم/مەسحکردنی هەموو سەر

شەشەم/مەسحکردنی هەموو گوێ لای دەرەوە و لای ژورەوە

حەوتەم/کردنی مشتێک ئاو بۆ ناو ڕیش

هەشتەم/پێشخستنی ئەندامەکانی لای ڕاست ، واتا یەکەمجار دەستی ڕاست ئینجا دەستی چەپ و یەکەمجار شوشتنی قاچی ڕاست ئینجا چەپپە

نۆیەم/شوشتن و مەسحکردنی ئەندامەکان سێجار سێجار ، (واتا سێجار ئاو لەدەمت وەردەی و سێجار ئاو لەلوتت وەردەی و سێجار دەموچاوت بشۆی و سێجار دەستەکانت بشۆی...

دەیەم/شۆردنی ئەندامەکان لەدوای یەک بەبێ تێکدانی ڕێزبەندیەکە

## مەرجەکانی دروستبوونی نوێژ:

مەرجەکانی دروستبونی نوێژ (پێنج)مەرجن...

یەکەم/پاکی هەموو ئەندامەکان لەبێدەسنوێژی گەورە و بچووک ، وەدەبێ لەشی و جلەکای پاکبێ لە هەموو پیسیەک

دووەم/دەبێ عەورەتی داپۆشێ،
تێبینی:عەورەتی پیاو لە ناوکەوە تا ئەژنۆیەتی بەڵام عەورەتی ئافرەت لەهەموو لاشەیەتی جگە لە دەست و دەموچاوی ، ئەویش لەناو نوێژ ، گەرنا لە دەرەوەی نوێژ ئەو دوو ئەندامەشی عەورەتە و دەبێ داپۆشێ،

سێیەم/ئەو شوێنەی نوێژی لێدەکا دەبێ پاکبێ،

چوارەم/دەبێ بزانێ کاتی نوێژ هاتوە،

**پێنجەم/ڕوکردنە قیبلە**

## ڕوکنەکانی نوێژ :

لەم بەشەدا باس لە ڕوکنەکانی نوێژدەکەین کە (حەڤدە) ڕوکنن و نوێژیان لێپێکدێت:

یەکەم/ نیەت هێنان لە دڵەوە

دووەم/ ڕاوەستان بە پێوە لە نوێژە ئەگەر توانای هەبێ

سێیەم/ گوتنی (الله اكبر) بۆ داخیلبونی نوێژەكە ،(بە وتنی ئەم وشەیە دەچیتە ناو نوێژەكەت)

چوارەم/ خوێندنی سوڕەتی فاتیحە لە هەموو ڕكاعەتێكدا

پێنجەم/ ڕكوع بردن

شەشەم/ خۆڕاگرتن لە ڕكوع

حەوتەم/ هەڵسانەوە لە ڕكوع

هەشتەم/ خۆڕاگرتن لە هەستانەوە لە ڕكوع

نۆیەم/ سوجدەبردن دوجار لە هەموو ڕكاعەتێک ، واتا سوجدە ببەی بەوشێوەی كە پێغەمبەرمان ﷺ باسیكردوە و دەفەرموێ ، فەرمانم پێكراوە سوجدە ببەم لەسەر تەوت ئێسقان (لەسەر نێوچاوان و لوت و هەردوو دەست و هەردوو ئەژنۆ و پەنجەكانی قاچ)

دەیەم/ خۆڕاگرتن لە سوجدە

یانزەیەم/ دانیشتن لەنێوان هەردوو سوجدە

دوانزەیەم/ خۆڕاگرتن لە دانیشتنی نێوان سوجدەكان ،

سێزدەیەم/ دانیشتن بۆ تەحیات

چواردەیەم/ خوێندنی تەحیات

پانزەیەم/ سەڵاوات لێدان لە تەحیاتی كۆتایی

شانزەیەم/ سەلامدانەوەی بەلای ڕاستدا دوایی بەلای چەپدا

حەڤدەیەم/ ڕیزكردنی ئەو خاڵانەی كە گوتمان ، واتا نابێ هیچ خاڵێكیان پێش هیچ خاڵێكیانبێ.

**تێبینی:ئاگەداربە ئەگەر هەریەكێک لەو كردارانەت نەكرد ئەوە نوێژەكەت هەڵدەوەشێتەوە و قبوڵنابێ.**

# سوننەتەکانی ناو نوێژ:

## ئەوانیش دەبن بە (پانزە) بەشەوە...

یەکەم/ بەرزکردنەوەی هەردوو دەستەکانی تا سەری پەنجەکانی دەگاتە بەرامبەر سەرەوەی گوێیەکانی

دووەم/دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەکاتی خوێندنی فاتیحە

سێیەم/خوێندنی دوعای دەستپێکردنی نوێژ

چوارەم/گوتنی (ئەعوذو بیللاهی مینەش شەیطانر رەجیم)

پێنجەم/ بەدەنگ خوێندنی فاتیحە و سوڕەتی دوای ئەو (تێبینی: ئەوە بەس بۆ ئیمامە نوێژی جەماعەت)

شەشەم/گوتنی (ئامین) جا لە نوێژی جەماعەتبێ یان نوێژەکەت بەتاکبێ

حەوتەم/ خوێندنی سوڕەتی دوای فاتیحە

هەشتەم/ گوتنی (ئەڵلاهو ئەکبەر) لەهەموو کاتی هاتنە خوارەوە بۆ ڕکوع و سوجدەکان و وە هەڵسانەوەکان

نۆیەم/ کاتێک لە ڕکوع هەڵسایەوە بابڵێ(سەمیعەڵلاهو لیمەن حەمیدە ، ڕەببەنا لەکەل حەمد)

دەیەم/ وتنی سێجار یان زیاتری (سوبحانە ڕەببی ئەل عەزیم)لە رکوع

یانزەیەم/ وتنی سێجار یان زیاتری (سوبحانە ڕەببی ئەل ئەعلا) لەسوجدە

دوانزەیەم/ دانانی هەردوو دەستەکان لەسەر هەردوو ڕانەکان لەبەینی هەردوو سوجدە

سێزدەیەم/ دانیشتن لەسەر قاچی چەپە لە هەموو دانیشتنەکانی نێوان سوندەکان و لەتەحیاتەکاندا

چواردەیەم/ دانانی نەرمایی ڕان لەسەر زەوی لەو دانیشتنیە سەلامدانەوەی بەدوادادێ (واتە کۆتا تەحیات) ، و داچەقاندنی قاچی ڕاستەی بەزەویدا و قاچی چەپەی بەلای ڕاستدا دەباتە دەرەوە نەرمە ڕانەکەی چەپی ئەلکێنێ بەزەویدا.

پانزەیەم/ سەلامدانەوەی دووەم



لەباسی ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە:

## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵەکەنەوە یانزە خاڵن...،

## یەکەم/ قسەکردنی بە ئەنقەست لەناو نوێژ

## دووەم/ جوڵەجوڵی زۆر

## سێیەم/ بێدەسنوێژی

چوارەم/ پەیدابونی پیسی بەجلەکانتەوە

پێنجەم/ دەرکەوتنی عەورەت(پێشتر باسمانکرد عەورەت لەکوێوە تاکوێیە)

شەشەم/ گۆڕینی نیەت لەناو نوێژەکەدا

حەوتەم/ لادان لە ئاستی قیبلە

هەشتەم/ خواردن بەئەنقەست

نۆیەم/ خواردنەوە بەئەنقەست

دەیەم/ پێکەنینی بەدەنگ

یانزەیەم/کافربون،(ئاگەداربن کەسێک کە کافربێ ئەوە نوێژی لێقبوڵناکرێ بۆیە بیکا و نەیکا وەک یەکە.

: : : : : : : : : : : : : : : : : : :

## چۆنیەتی نوێژکردن:

بسم الله الرحمان الرحیم

بەناوی خودای بەخشندی مێهرەبان ، پێش هەموو شتێک نوێژ بریتیە لە کۆڵەکەی دینە و یەکەمین پایەیە لە ئەرکانەکانی ئیسلام لەدوای دوو شەهادەکە، نوێژ بریتیە لەو نێوەندەی کە تۆ هەست بە بەندایەتی خۆت و خوایەتی الله دەکەی ، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێکمان نوێژ دەکەین بەڵام تەنیا ڕواڵەتە و نازانین لە بەرامبەر کێ ڕاوەستاوین ، بەداخەوە لە نوێژەکانمان هیچ خشوع و ترسێک نیە و هیچ لەزەتێکی نیە ، بۆیە إن شاء الله لێرەدا باسی چونیەتی نوێژ و ماناکەی دەکەین إن شاء الله

١- ئێمە پێش هەموو شتێک دەبێ سەیری ئەوەکەین ئایا کە پێش ئەوەی بڕۆینە ناو نوێژ چەند کردارێک هەیە دەبێ لەخۆمان جێبەجێکردبێ ، وەک دڵنیابوون لە پاکی خۆت ، دڵنیابوون لە پاکی جلەکانت ، نابێ عەورەتت بەدیارکەوێ(ئاگەداربە عەورەتی ئافرەت هەموو لاشەیەتی جگە لە دەست و دەم و چاوی ، بەڵام عەورەتی پیاو لە ناوکەوە بۆ ئەژنۆیەتی) ، هەبوونی دەسنوێژ ، دەبێ ئەو شوێنەی نوێژی لێدەکەین پاک بێ ، ڕوکردنە قیبلە)،

ئینجا لەدڵی خۆمانا نیەت دێنین و دەڵێین (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ) واتا خودا گەورەترینە ، بەوتنی (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ) دەبێ وابێنینە بیری خۆمان کە تەواو ئێمە داخیلی نوێژەکە بوین و ئێستا لەبەر دەمی خودا ڕاوەستاوین و الله سەیرمان دەکا و گوێی لێمان گرتوە و ئێمە قسەی بۆدەکەین،

٢- ئینجا دەست پێدەکەین بە خوێندنی سوڕەتی (فاتیحە) کە پێشتر مانا و شێوازی خوێندنەوەیمان باسکردوە ، لەدوای ئەویش سوننەتە سوڕەتێکی دیکە بخوێنی جا هەر سوڕەتێکبێ ،

٣- دوای دەڵێین (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ) و دەچینە ڕکوع ، لەوێ سێجار یان زیاتر دەڵێین (سوبحانە ڕەببی ئەلعەزیم)، واتە (پاک و بێگەردی هەر بۆتۆیە ئەی خودای گەورە)

٤- دوایی لە ڕکوع هەڵدەستینەوە و دەڵێین (سەمیحەڵڵاهو لیمەن حەمیدە) خودایە تۆ شکرانە و سوپاس گوزاریەکەی منت بیست

دوایی دەڵێی (ڕەببەنا وەلەکەل حەمد) واتا خودایە سوپاس و شوکرانە هەر شایستەی تۆیە

تێبینی:پێویستە لەکاتی چونە ڕکوع و هەڵسانەوە لێی سەبربگری و بمینێیەوە بەلایەنی کەمەوە ٣ چرکە چونکە پەلەکردن لە نوێژ و نەوەستان لە ڕکوع و سجود و بەینەکانیان ئەوە نوێژی (مونافیق)دوڕوە و قبوڵنیە ئەو نوێژە ، خودای گەورە پەنامانداا ،

٥- دوای ئەوەی لە ڕکوع مایەوە پاشان دەڵێی (ئەڵلّهو ئەکبەڕ) و دەچیە سوجدە ، پاشان سێجار یان زیاتر دەڵێین (سوبحانە ڕەببی ئەل ئەعلا) واتا پاکو بێگەردی بۆتۆ ئەی خودای بەرز و بڵند ، دوای لەدوای وتنی دەڵێینەوە (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ) و دەڕۆینە بەینی سوجدەکان و دووجار دەڵێین (ڕەببیغ فیرلی) واتە خودایە لێمخۆشبە ، پاشان دیسانەوە دەچینەوە سوجدە و دیسان سێجار یان زیاتر دەڵێین (سوبحانە ڕەببی ئەل ئەعلا) واتە پاک و بێگەردی بۆتۆ ئەی خودای بەرز و بڵند ، پاشان هەڵدەستینەوە و دەڵێینەوە (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ)

پاشان لە ڕکایەتی دووەمیش بەهەمان شێوە ئەو زکرانە دوبارە دەکەینەوە و دێینە تەحیات

٦- تاحیاتیش بەم شێوەیە ئەخوێنررێ:

زکر/{التحيات لله، والصلوات والطيبات، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله}

**چۆنیەتی خوێندەوەی/ ئەتتاحیات و لیللاهی وەسسەلاوات و وەتەییات ، ئەسسەلام و عەلەیکە ئەیو هەننەبییو وە ڕەحمەتوڵڵاهی وەبەرەکات ، ئەسسەلام و عەلەینا وە عەلا عیبادیللاهیسساڵیحین ، ئەشهەدو ئەل لائیلاهە ئیللاڵڵا ، وەئەشهەدو ئەننە موحەممەدەن عەبدوهو وەڕەسولو**

واتاکەی/ ڕێز و گەورەیی و شکۆ و سوپاسکردن تەنیا بۆخودایە ، ئەی پێغەمبەر ﷺ سڵاو و ڕێز وبەرەکەتی ئەڵڵات بەسەردا برژێ ، سڵاو و ڕێزی و بەرەکەتی ئەڵڵا برژێ بەسەر ئێوە و هەمووبەندە ساڵحەکان ، شایەتی دەدەم هیچ خوایەکنیە بەهەق جگە لە ئەڵڵا و تاک و تەنیایە و هیچ هەواڵێکی نیە ، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەدیش بەندە و نێردراوی خودایە

(له تەحیاتی یەکەم ئەوە دەخوێنی ئەگەر نوێژەکەت دوو تەحیاتی تێدابوو ، وەک نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب وعیشا) ،

وە له تەحیاتی دووەمدا ، ئەو سەڵاواتی بۆزیادداکەی و لەپاش وتنی ئەو تەحیاتە دەڵێی:

زکر/ اللهم صل على محمد، وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم، وعلى آل إبراهيم، إنك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد، وعلى آل محمد، كما باركت على إبراهيم، وعلى آل إبراهيم، إنك حميد مجيد

چۆنیەتی خوێندنەوەی/ (ئەڵڵاهوم مەسەللِلی عەلا موحەممەد وەعەلا ئالی موحەممەد کەما سەڵەیتە عەلا ئیبڕاهیمە وەعەلا ئالی ئیبڕاهیم ئیننەکەل عەمیدوم مەجید ، ئەڵڵاهم مە بارک عەلا موحەممەدی وەعەلا ئالی موحەممەد ، کەما بارەکتە عەلا ئیبڕاهیمە وەعەلا ئالی ئیبراهیم ئیننەکە حەمیدوم مەجید)

واتاکەی/خودایە درود و سەلام بڕژێنە بەسەر موحەممەد و ئالی موحەممەد ، هەروەک چۆن درود و سەلامت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم بەڕاستی تۆ سوپاسکراو و شکۆدار و بەڕێزی

ئەوش کۆی نوێژ کردن،

تێبینی:ئەگەر نوێژەکە ٣ یان ٤ ڕکاتبوو ئەوە هەر ئەم شتانە دوبارە دەکەیەوە

# زیکرەکانی دوای نوێژ:

یەکەم زیکر/

کاتێک سەلامت دایەوە لەنوێژ ٣جار بڵێ ، ئەستەغفیروڵڵا (أستغفرالله)

دووەم زیکر/

لەپاشان بڵێ:

زیکر/ (اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت يا ذا الجلال والاكرام، )

شێوازی خوێندنەوەی/ (ئەڵڵاهوم مەئەنتەس سەلام وەمینکەس سەلام ، تەبارەکتە یا ذول جەلالی وەلئیکرام)

واتاکەی/ خودایە تۆ ئاشتی و لە تۆوە ئاشتی و ئارامی هەیە ، بەختەوەریم بەسەردا برژێنە ئەی خاوەن شکۆمەندی و شەرەف

سێیەم زیکر/

خوێندنی ئایەتەی کورسی (لە پێشتر باسمان کردوە)

چوارەم زیکر/

وتنی ٣٣جار(سوبحانەڵڵا) [سبحان الله]،

٣٣جار(ئەلحەمدولیللا) [الحمدلله]،

٣٣جار(ئەڵڵاهو ئەکبەر) [الله اكبر]،

وەپاشان بڵێ(لا ئیلاهە ئیللەڵڵا وەحدەهو لا شەریکەلە ، لەهول مولک و وەلەهول حەمد و وەهوە عەلا کوللی شەیئین قەدیر) .

پێنجەم زیکر/

یەکی جارێک ئەم سورةنە بخوێنە [سورةی ئیخلاس (الإخلاص)، سورةی فلق (الفلق)، سورةی ناس(الناس)]

# زیکرەکانی بەیانیان :

تێبینی: (ئەم زکرانە لە پاش نوێژی بەیانیەوە دەتوانی بیکەی وە چەندیش زووتر بیکەی باشترە) والله اعلم

زکری یەکەم/

خوێندنی ئایەتی کورسی کە لەپێشتر باسمانکردوە

زکری دووەم/

خوێندنی سێ جار [سورةی ئیخلاس (الإخلاص)، سورةی فلق (الفلق)، سورةی ناس(الناس)] کە لەپێشتر باسمان کردوە

زکری سێیەم/

ئەسباحنا وە ئەسبەحەل مولکو لیللا ، وەل حەمدولیللا ، وەلا ئیلاهە ئیللەڵلاهو وەحدەهو لا شەریکەلە ، لەهول مولک و وەلەهول حەمدو وەهوە عەلا کوللی شەیئین قەدیر ، ڕەببی ئەسئەلوکە خەیرە مافی هاذەل یەومی وەخەیرە مابەعدە ، وە ئەعوذوبیکە مین شەڕری مافی هاذەل یەومی وەشەڕری ما بەعدە ڕەببی ئەعوذوبیکە مینەل کەسەل ، وەسوئیل کیبەڕ ، ڕەببی ئەعوذو بیکە مین عەذابین فیننارى وەعەذابین فیل قەبڕ

واتاکەی/

ئێمە بەیانمانکردەوە و هەموو موڵک و دەسەڵاتیش هەربۆ لای خوایە ، وە سوپاس و ستایشیش هەر بۆ خوایە ، وەهیچ خودایەک نیە بپەرسترێ بەهەق تەنیا الله نەبێ و ئەو تاک و تەنیایە و هیچ هەواڵێک و هاوشێوەیەکی نیە ، هەرچی هەیە هەر هی ئەوە و ئەو خۆی پاشایە و هەموو سوپاس گوزارێکیش هەر بۆئەوەو وە ئەو خوایە بەسەر هەموو شتێکدا لەژیانمان زاڵە ، خوایە داوای چاکەی ئەوڕۆژە و داوای چاکەی دوای ئەوڕۆژەشت لێدەکەم ، وە خۆم بەتۆ لە هموو شەڕ و خراپەی ئەمڕۆ و دوای ئەمڕۆ دەپارێزم ، خودایە پەنابەتۆدەگرم لە ستستی و تەمبەڵی ، و خۆبەگەورەزانی ، وە خۆم بەتۆ لەدوردەگرم لە عەزابی ئاگر ، و عەزابی قەبر.

### زکری چوارەم/

ئەڵڵاهوم مەعافینی فی بەدەنی ، ئەڵڵاهوم مەعافینی فی سەمعی ، ئەڵڵاهوم مەعافینی فی بەسەڕی ، لا ئیلاهە ئیللا ئەنت ، ئەڵڵاهومە ئیننی ئەعوذوبیکە مینەل کوفر ، وەل فەقرِ ، وەئەعوذوبیکە من عەذابیل قەبرِ ، لا إلاهە ئیللا ئەنت.

(سێ جار بیخوێنەوە)

### واتاکەی/

خودایە تەندروستیم باشبکە ، خودایە خودایە بیستن و گوێم سەلامەتبکە ، خودایە خودایە چاو و بینینم سەلامەتبکە ، خودایە جگە لەتۆ هیچ خودایەک نیە بەهەق ، خودایە بەتۆ خۆم دەپارێزم لە بێ باوەڕی ، و لەهەژاری ، و لە ئازاری ناوگۆڕ ، خودایە جگە لەتۆ هیچ خودایەک نییە بەهەق.

(لە بەیانیان و ئێواراندا ٣ جار بیخوێنەوە)

### زکری پێنجەم/

حەسبی ئەڵڵاهو لا ئیلاهە ئیللا هوە عەلەیهی تەووەکەلتو وەهوە ڕەببول عەڕشیل عەزیم.

(حەوت جار بیخوێنەوە)

### واتاکەی/

ئەو خوایەم بەسە (کە اللەیە) و تاک و تەنیایە و جگە لەو هیچ وایەکی ترنیە ، پشت بەو دەبەستم ، ئەو پەروەردگارە پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

(بەیانیان و ئێواراندا حەوت جار بیخوێنەوە)

## زکری شەشەم/

ڕەدیتو بیللاهی ڕەببا ، وەبیل ئیسلامی دینا ، وەبی موحەممەدین ﷺ نەبیا

(سێ جار یان زیاتر بیخوێنەوە)

واتاکەی/

ڕازیم کە پەروەردگارم (الله)بێ ، وە ئیسلام دینمبێ ، وە موحەممەد ﷺ پێشەوامبێ.

(سێ جار یان زیاتر لە بەیانیان و ئێوارانداا بیخوێنە)

## زکری حەوتەم/

لا ئیلاهە ئیلا ئەڵڵا وەحدەهو لا شەریکەلە ، لەهول مولک و وەلەهول حەمد ، وەهوە عەلا کوللی شەیئین قەدیر.

(لە بەیانیان و ئێوارانداا دەجار بیخوێنە)

واتاکەی/

هیچ خودایەک نیە بەهەق شایستەی پەرستنبێ جگە لە (الله) نەبێ و ئەو زاتە تاک و تەنیایە و هیچ هەواڵ و هاوبەشێکی نیە ، هەرچی موڵک و سوپاسکردنە تەنیا دەبێ هەمووی هی ئەوە و تەنیا دەبێ بۆئەوبێ ، و ئەوزاتە بەسەر ەەموو شتێک دەسەڵاتدارە.

(لەکاتی توشبون بە هەر بەڵا و ناخۆشیەک دەجار یان زیاتر بیخوێنە)

هەشتەم/

سوب حانەڵڵا وەبیحەمدی

(هەوڵدە لە ڕۆژێکدا زیاتر لە سەدجار بیخوێنە)

واتاکەی/

پاکو بێگەردی تەنها بۆ خودایە و سوپاس وستایشیش تەنیا شایەنی ئەوە

زکری نۆیەم/

سوبحانەڵڵا وەبیحەمدی عەدەدەخەلقی ، وەڕیدا نەفسی ،

وەزینەتە عەرشی ، وەمدادە کەلیماتی

(لە بەیانیان و ئێواران سێجار یان زیاتر بیخوێنەوە)

واتاکەی/

پاک و بێگەردی بۆ خودا و سوپاس وسیتایشیش تەنیا بۆئەو ، بەقەد ژمارەی دروستکراوەکانی ، وەڕەزامەندی خۆی ، و بەقەد کێش و گرانی عەرشەکەت ، و بەقەد زۆری و فراوانی وشەکانی.

زکری دەیەم/

ئەعوذو بیکەلیماتیل لاهیت تامماتی مین شەڕری ماخەلەق

(٣ جار لە ئێوارناندا بیخوێنە)

واتاکەی/

خۆم دەپارێزم بە وشە بەرز و تەواوەکانی خودای گەورە ، لە زیان و خراپەی هەرچی خودا دروستی کردوە.

## زکری یانزەیەم/

## ئەڵڵاهوم مەسەڵلی عەلا نەبیینا موحەممەد

## (لە بەیانیان و ئێواران ١٠ جار یان زیاتر بیخوێنە)

واتاکەی/

خودایە درود وسەلامی بێکۆتا بڕژێنە بەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ



## زیکرەکانی کاتی خەوتنان:

ئەم زکرانە لەدوای نوێژی عیشا دەتوانی بیکەی تا کاتی خەوتن بەڵام چەند درەنگتر بیکەی باشترە، (الله اعلم)

زکری یەکەم/

خوێندنی ئایەتی کورسی(لەپێشتر باسمان کردوە)،

زکری دووەم/

خوێندنی ٣جار سوڕەتی (ئیخلاس ، ناس ، فەلەق) واتە یەکی ٣جار بیانخوێنیەوە ،(ئەویش لەپێشتر باسمان کردوە و تەفسیرمان کردوە) ،

زکری سێیەم/

وتنی ٣٣جار (سوبحانەڵڵا) ٣٣ جار (ئەلحەمدو لیللا) ٣٤ جار (ئەڵڵاهو ئەکبەڕ)

زکری چوارەم/

خوێندنی ٤جار سورەتی(فاتیحە)

زکری پێنجەم/

بیسمیکەڵڵاهوم مە ئەموتو وە ئەحیا

واتاکەی/

خودایە بەناوی تۆوە دەمرم و دەژیمەوە

زکری شەشەم/

خوێندن یان گوێگرتن لە سوڕەتی(مولک و سوجدە)

زکری حەوتەم/

خوێندن یان گوێگرتن لە دوو ئایەتی کۆتایی سوڕەتی بەقەڕە



ئەو نوێژە سونەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ زۆر گرینگی پێداوە و بەشێکیانی هەرگیز واز لێنەهێناوە:

## ٢ ڕکایەت پێش نوێژی بەیانی

## ٤ڕکایەت پێش نوێژی نیوەڕۆ و ٤پاشی

## ٤ڕکایەت پێش نوێژی عەسر

## ٢ڕکایەت پاش نوێژی مەغریب

## ٢ڕکایەت پاش نوێژی عیشا

## ئەنجامدەری ئەم ١٧ کارە فریشتە دوعایان بۆ دەکات .

1- هەرکەسێك شەوان بە دەست نوێژ بخەوێت.

2 - هەرکەسێك دابنیشت و چاوەروانی کاتی نوێژ بکات.

3 - هەرکەسێك لە ڕێزی پێشەوەێ نوێژی جەماعەت بێت.

4 - هەرکەسێك لە نوێژی جەماعەت لە لای راستی ئیمامەوە بێت.

5 - هەرکەسێك ڕیزی نوێژی جەماعەت بەیەکتری بگەیەنێت.

6 - ئەوانەی کە دەڵێن (ئامین) لە نوێژی جەماعەتدا.

7 - هەرکەسێك بمینێتەوە و دابینشێت لە دوای نوێژی جەماعەت.

8 - هەرکەسێك نوێژی بەیانی و عەسر بە جەماعەت ئەنجام بدات.

9 - هەرکەسێك درووود و صلاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ .

10 - هەرکەسێك بۆ برایەکی موسڵمانی بپارێتەوە بە پاشملە.

11 - هەرکەسێك مال و سامان ببەخشێت لە پێناو خودا.

12 - هەرکەسێك بە رۆژوو بێت و پاش شێو بکات.

13 - هەرکەسێك میوانی رۆژووانی هەبێت و بۆی بپارێتەوە.

14 - هەرکەسێك سەردانی نەخۆش بکات.

15 - هەرکەسێك قسەی خێر بکات لەسەر نەخۆش، یان لەسەر مردوو

16 - هەرکەسێك خەڵك فێری کاری خێر و باش بکات.

17 - هەرکەسێك تەوبە بکات و بگەرێتەوە بۆ لای خودا.

## چەند باسێک لە باسی خودادا...

ئەگەر لێیان پرسی خوای تۆ کێیە؟

تۆدەڵێی؛ (الله)

ئەگەر لێیان پرسی بەچی خوای خۆت دەناسیەوە؟

تۆش دەڵێی؛ بە ئایەتەکانی و بەو شتانەی دروستی کردوە وەک(خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و زەوی و ئاسمانەکان)

ئەگەر لێیانپرسی پەروەردگارت لەکوێیە؟

تۆش لە وەڵامدا دەڵێی؛ لەسەروی حەوت تەبەقەی ئاسمانە لەسەر عەرشەکەی

## چەند زانیاریەک دەربارەی پێغەمبەرامان موحەممەد ﷺ :

- ناوی مومەممەدی کوڕی عبداللەی کوڕی عەبدول موتەڵیبی کوڕی قاسمە،

- لەساڵی فیل لەدایکبوە،

- ناوی دایکی ئامینەبوە،

- پێش لەدایکبونی باوک کچی دوای کردوە و ، لەتەمەنی ٦ ساڵی دایکی کۆچی دوایی کردوە و دوایی باپیری بەخێویکردوە ،

- پاشان لەتەمەنی ٨ ساڵی باپیریشی کۆچی دوایی دەکا و دوایی عەبدول موتەڵیبی مامی لەخۆی دەگرێ

- لەتەمەنی ٢٥ساڵی هاوسەرگیری لەگەڵ دایکە خەدیجەمان دەکا کە ئەوکاتە دایکە خەدیجەمان تەمەنی ٤٠ساڵبوو ،

- پێشەوی بێتە پێغەمبەر پیشەی شوانی و بازرگانی کردوە

- لەتەمەنی ٤٠ ساڵی سروشتی بۆدێ و دەبێت بە پێغەمبەر،

- ٢٣ ساڵ دعوی کردوە ، ١٣ساڵ لە مەککە و ، ١٠ ساڵ لەمەدینە،

- لەتەمەنی ٦٣ساڵی کۆچی دوایی کردوە ،

- پێغەمبەرمان ﷺ ١١ خێزانی هەبوە،

- ١٢ مامی هەبوە ، دوو مامی ئیمانیان پێهێنا ئەوانیش(حەمزە و عەباس)بوون،

- ٦ پوری هەبوە،

-- ٧ منداڵی هەبوە (٤ کچ و ٣ کوڕ)،
- ناوی کوڕەکانی/ قاسم ، عەبدوڵلا ، ئیبراهیم،
- ناوی کچەکانی/زەینەب ، ڕوقیە ، ئوم کەلسوم ، فاتیمە،

- هەموو منداڵەکانی ، پێشە خۆی مردون تەنیا (فاتیمە)نەبێ ، ئەویش شەش مانگ دوای خۆی وەفاتی کرد،

- پێغەمبەر ﷺ ١ حەج و ٣حەمرەی لە تەمەنی خۆی کردوە.

# (بەهیوای سود إن شاء الله)

{وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين}. اللهم امين

نووسین و کۆکردنەوەی:
أبو عائيشه الكردية